زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

# عیسا پێغەمبەر

سەلامی خوای لێبێت





# زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

# عیسا پێغەمبەر

## سەلامی خوای لێبێت

بسم الله الرحمن الرحیم


ناوی نامیلکە: عیسا پێغەمبەر

سەلامی خوای لێبێت

ئامادەکردنی: محمد عەلی قەرەداغی

چاپ و دیزاین: ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

تیراژ: (٢٠٠٠) دانە

نرخ: (١٥٠٠) دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (١٧٦٧) ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە


ARA Media Center

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا



لەسەردەمی حەزرەتی زەکەریادا
لەبەنی ئیسرائیلدا پیاوچاکێك هەبوو
ناوی (عیمران) بوو، ژنێکی باشی
خوداپەرستی هەبوو ناوی (حنە) بوو.
حەننە لەسەر خۆی نەزر کرد ئەگەر
خودا کورێکی بداتێ بیکات بە
ئیشکەرو خزمەتچی مزگەوتی
(بیت المقدس).

خوداى پەروەردگار دۆعاكەى حەننەى گیرا كردو سكى بوو و دووگیان بوو، پێش ئەوەى منداڵەكەى ببێ مێردەكەى مرد. حەننە لەژێر چاودێرى خوشكەكەیدا كە خێزانى زەكەریا بوو مایەوە تا منداڵەكەى بوو، كچێكى جوانكیلەى بوو ناوى نا (مەریەم).



زەکەریا سەرپەرشتی مەریەمی کرد، مەریەم بۆ کارێکی زۆر پێویست نەبوایە قەت لە مزگەوتەکەی نەدەچوە دەرەوە. مەریەم لە خوداپەرستییەکەیدا زۆر بەسۆز و ڕاست و پاك بوو. تا وای لێ هات لە ناو بەنی ئیسرائیلدا بە پاك و خاوێن ناسرا.



ڕۆژێك كاتێ خاتوو مەریەم لە مزگەوتەكەیدا نوێژی
دەكرد. خودای پەروەردگار جوبرەئیلی لە شێوەی
ئادەمیزاددا نارد بۆ لای. مەریەم لێی ترسا. بەڵام
جوبرەئیل دڵی دایەوەو موژدەی دایێ كە خودا
كوڕێكی پێ دەبەخشێ. مەریەم لەو قسە سەری
سوڕماو وتی: من چۆن شووم نەكردوەو منداڵم دەبێ؟



جوبرەئیل بە مەریەمی وت: ئەمە ویستی خودایەو، ئەوەیش
بە لای خوداوە ئاسانە و، موژدەی ئەوەیشی دایێ کە
کوڕەکەی دەبێ بە نیشانەو موعجیزەیەکی
گەورە لەلایەنی خوداوە
بۆ خەڵك.





کاتێ خاتوو مەریەم سکی
بوو، چوو لەشوێنێکی
دوور لە خەڵکدا گۆشەی
گرت، تا منداڵێکی جوانی
بوو ناوی عیسا بوو.
مەریەم هاتەوە بۆ ناو
گەلەکەی و عیسای بە
باوەشەوە بوو.

که لە بارەی کوڕەکەیەوە لێیان بپرسیایە وەڵامی نەدەدانەوەو ئاماژەی بۆ کوڕەکەی دەکرد. گەلەکەی وتیان: چۆن لەگەڵ منداڵی بەرمەمکەدا قسە دەکرێت؟ خودا عیسای هێنایە زمان و وتی: من بەندەی خودام و پەیامی داومەتێ و کردوومی بە پێغەمبەر.



عیسا عليه السلام لەکۆشی دایکی و لە چاودێری ئەودا
بە شێوەیەکی باش پەروەردە بوو. کە گەورەبوو
دەستی کرد بە بانگکردنی خەڵک بۆ
خوداپەرستیی.



بەنو ئیسرائیل کاتێ نیشانەکانی پێغەمبەریێتیی عیسایان بینی حەسادەتیان پێ بردو ئازارو ئەشکەنجەی خۆی و دایکییان دا. جوولەکە بەوەوە نەوەستان و چوون بۆ لای پاشای وڵات و دژی عیساو دایکی هانیان دا. مەریەم ترساو (بیت المقدس)ی بە جێ هێشت و لەگەڵ عیسادا چوون بۆ میصر.



عیسا (عليه السلام)و دایکی پاش ئەوەی ماوەیەك
لە میصردا بوون گەڕانەوە بۆ فەلەستین
و، عیسا (عليه السلام) خەڵکی فێری ئینجیل
دەکرد. خودا پشتگیریی ئایینەکەی
عیسای بە چەند موعجیزە کردبوو،
لەوانە: نەخۆشی چاك دەکردەوەو،
مردووی زیندوو دەکردەوەو، هەواڵی
ئەوەی بەخەڵك دەدا لەماڵەوە چی
دەخۆن و چی پاشەکەوت دەکەن.



چەند کەسێکی کەم باوەڕیان بەعیسا (عليه السلام) هێناو بوون بەکۆمەککەرو شوێنکەوتووی. هاوەڵەکانی حەزرەتی عیسا داوایان لێکرد خودا لەئاسمانەوە سفرەو خوانێکیان بۆ بنێرێتە خوارەوەو ئەمە ببێ بە موعجیزەیەکی دیار بۆیان. حەزرەتی عیسا (عليه السلام) داوای لە خودا کردو خودا سفرەیەکی گەورەی بۆ ناردنە خوارەوەو هەموو (دەوڵەمەندو هەژار) لێیان خوارد.



لەگەڵ ئەم هەموو موعجیزەیەدا جوولەکە هەر لەسەر بێباوەڕیی و سەرسەختیی خۆیان مانەوەو بڕیاریان دا عیسا بکوژن، بەڵام خودای پەروەردگار عیسای پاراست و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان.



# زنجیرەی چیرۆکی پێغەمبەران

## (١٠) نامیلکە




ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا





0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669

www.ara-m.com | ara.m@hotmail.com

ARA Media Center

نرخی (١٥٠٠) دینارە